# باشترین کارەکانی موسوڵمان

ئامادەکردنی
محمد ملا فائق شارەزووری

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَه، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَه، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُه ﷺ. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ (آل عمران)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ (النساء)

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ (الأحزاب)

أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَة، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ. أَمَّا بَعْد [1].

---

١- ((وردت هذه الخطبة المباركة عن ستة من الصحابة وهم: عبدالله بن مسعود، وأبوموسى الأشعري، وعبدالله بن عباس، جابر بن عبدالله، ونبيط بن شريط، وعائيشة رضي الله عنها، وعن تابعي واحد.. وهو الزهري رحمه الله)).

# باشترین کارەکانی موسوڵمان

لـەم باسـەدا دەچینە خزمـەت بابەتێك بە ناونیشـانی باشترینەکان، دەچینە خزمەت پێغەمبەری ئازیز ﷺ تا بزانین باشترین کارەکان، کە موسوڵمان پێی هەستێت چی یە؟ یاخود لە ناو موسوڵمانانیدا باشترین کەسیان لای خوای گەورە کێن؟

بە بیستنی ئـەم فەرمـوودە صەحیحانـەی پێغەمبەری خـوا ﷺ بۆمـان دەردەکەوێـت کە ئەم ئیسلامە پڕ خێرو فـەڕ و ڕەحمەت و میهرەبانیە و کەسـی بێ بەش نەکردووە، هەرکەسێك بەهرەیەکی داوەتێ، ئەو بەهرەیەیش کە خوا پێی داوە دەتوانێت لە بـواری خۆیدا بەگەڕی بخات، دواتریش ئەو یەکێکە لە کارە چاکە گەورەکان لای خوای گەورە و میهرەبان. زۆرینـەی ئەم فەرمووودانـەش پێغەمبەری ئازیز ﷺ وشـەی (أَفْضَل) یان (خیر)ي، تیادا بەکارهێناوە، واتە: باشترین.

## باشترین بڕواداران

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ المُؤمنينَ إِسْلاماً، مَنْ سَلِمَ المُؤمنينَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ))[٢] واتە: باشترین بڕواداران لە موسوڵمانانیدا، ئەوانەیانـن کـە تێکڕایی موسـوڵمانان لە دەسـت و زمانیان سـەلامەتن. هەروەهـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێـت:

٢- صحيح : (السلسلة الصَحيحَة) ( ١٤٩١ )،( صَحيح الجَامع) (١١٢٥).

((أَفْضَلُ الْمُؤمِنِينَ إِيمَاناً، أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً))[٣]: واتە: باشترینی بڕواداران لە بڕواداریدا، ئەوانەن کە ڕەوشت یان لە هەمووان جوانترە.

## باشترین کۆچکردن

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الْمُهاجرين، مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللهُ عَنهُ))[٤] واتە: باشترینی کۆچکردووەکان، ئەوانەن کە کۆچیان کردووە لە تاوان و گوناهەکان لە پێناوی خوادا و وازیان لێ هێناون و خۆیان لێ بە دوورگرتوون.

## باشترینی خەڵکی

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ النَّاس، مُؤْمِنٌ بَينَ كَرِيمَيْنِ))[٥] واتە: باشترینی خەڵکی، ئەوانەیانن کە لە دایك و باوکێکی چاك و صاڵحە وە هاتوونەتە دونیاوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ النَّاس، مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ في سَبيلِ الله، ثُمَّ مُؤْمِنٌ في شِعْبٍ مِنَ الشِّعَاب))[٦] واتە: باشترینی خەڵکان، ئەوانەن کە بڕوادارن و تێدەکۆشن لە پێناوی خوادا، بە سەر وماڵیان. پاشان لە دوای ئەوان باشترین بڕوادار، ئەوەیە کە لە

---

٣- صحيح : (الإيمان) (١/٧)، (صَحيح الجَامع) (١١٢٥).
٤- صحيح : (صَحيح الجَامع) (١١٢٩).
٥- صحيح : (صَحيح الجَامع) (١١٣٠)، (الصَّحيحة) (١٥٠٥).
٦- صحيح : (صَحيح الجامع) (١١٣١)، (الصَّحِيحة) (١٥٣١).

شـیوێك لە شیوەکان لەگەڵ مەڕەکانی دا دەژی و خودای خۆی دەپەرستێت، خۆی لە زیانی خەڵکی بـە دوور دەکات، زیانی خۆیشی بە دوور دەگرێت لە خەڵکی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ النَّاس، كُلُّ مَخْمُوم قَلْبٍ الصَّدوق اللِّسَان)) واتە: باشـترینی خەڵکان، ئەوانەن کە خاوەنی زمانێکـی ڕاسـتگۆن وە خاوەنی دڵێکی ((مَخْمُوم))ن، وتیان: دڵی ((مَخْمُوم)): کام جۆر دڵە یـە؟، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هُوَ النَّقي، التَّقِي، الَّذي لاَ إثْمَ فيهِ، وَلاَ بَغي، وَلاَ غِلَّ، وَلاَ حَسَدَ))[7]: واتە: ئەو دڵەیە کە پاکە و گوێ ڕایەڵە بۆ خوا وهیچ کینە و ڕقێك و بەخیلی وحەسودی وحەز کردنێکی لە تاوان تێدا نی یە.

وتیان: لە پاش ئەو کێ باشـترین کەسی ناو موسوڵمانانە؟، فەرمـووی: ((الَّذي يَشْنَأُ الدُّنيَا، وَيُحِبُّ الآخِرة)) واتـە: ئەوانەیانن کـە دونیا یان لەلا بێزرا و قێزەونە و خۆشـیان ناوێت، بەڵام قیامەت یان زۆر لا خۆشەویستە.

پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرموێـت: ((أَفْضَلُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ القُرآنَ وَعَلَّمَهُ))[8] واتە: باشترین کەسی ناو ئێوە ئەوانەتانن کە قورئان فێردەبن و پاشان فێری کەسانی تری دەکەن.

---

٧- صحيح: (صحيح الترغيب) (٢٨٨٩)، (صحيح ابن ماجة) (٤٢١٦)، (الصَّحيحة) (٩٤٨).

٨- صحيح: (صحيح ابن ماجة) (٢١٢)، (صحيح الترمزي) (٢٩٠٨)، (الصَّحيحة) (١٦٨/٣).

# باشترینی بەندەکانی خوا

پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ عِبَادِ اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ الحَمَّادُونَ))[٩]: واتە: باشـترین بەندەکانی خودا لە ڕۆژی کۆتایدا ئەوانەیان کە هەردەم سـوپاس گوزار بـوون لە هەموو کات و ساتەکاندا.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيرُ النَّاسِ، أَنْفَعُهُم لِلنَّاسِ))[١٠] واتە: باشـترینی خەڵکان ئەوانەیانن کە بەسود ترین کە سانن بۆ ناو خانەوادە و خزمان و کۆمەڵگای خۆیان.

پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُكُمْ مَنْ طَالَ عُمْرُهُ، وَحَسُنَ خُلُقُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ)) واتە: باشترینتان ئەوانەتانن، کە تەمەن درێژن بەڵام ڕەوشت و ئاکارەکانیان جوانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خِيَارُكُمْ فِي الجَاهِلِيَّةِ، خِيَارُكُمْ فِي الْإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا))[١١] واتە: چاکترینتان لەنەفامیدا چاکترینتانە لە ئیسلامدا گەر بەباشی لە ئیسلام حاڵی بووبن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيرُ النَّاسِ [خَيْرُكُمْ] أَحْسَنُكُم قَضَاءً))[١٢]: واتە: چاکترینی خەڵکان ئەوانەتانن کە قەرزەکانیان زۆر بە جوانی ئەدەنەوە بە خاوەنەکان.

---

٩- صحيح : (الصحيحة) (١٥٨٤)، (صحيح الجامع) (١٥٦٦).
١٠- صحيح : (الصحيحة) (٤٢٦)، ( صحيح الترغيب) (٩/١)، (تراجعات) (١٩)،
١١- صحيح : أحمد (١٠٢٩٥) (١٠٢٩٦)، قال محققوه: اسناده صحيح على شرط (مسلم).
١٢- صحيح : (صحيح الترغيب) (١٧٥٢)، (صحيح الجامع)(٢٠٦١)، (صحيح الترمذي) (١٣١٧).

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيرُكُمْ مَنْ يُرْجَى خَيْرُهُ، وَيُؤمَنُ شَرُّه))(١٣) واتە: چاکترینتان ئەوانەتانن کە ئومێدی هەموو باشەیەکتان لێدەکرێت، خەڵکی متمانەی تەواو یان هەیە پێتان، ئەو جۆرە مرۆڤانە زیان بە هیچ کەسێك ناگەیەنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيرُكُمْ، خَيرُكُمْ للأَهْلِه))(١٤) واتە: چاکترینتان ئەوانەتانن کە باشترینتانن بۆ هاوسەرکانیان.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خِيَارُكُمْ أَلْيَنُكُمُ مَنَاكِبَ فِي الصَّلاَة))(١٥) واتە: باشترین تان ئەوانەتانن کەشانیان نەرمە بۆ لای ڕاست و چەپیان، لە ڕیزەکانی نوێژدا و ئازار یان نادەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيرُكُمْ مَنْ أَطْعَمَ الطَّعَام، وَرَدُّ السَّلام))(١٦) واتە: باشترینتان ئەوانەتانن کە خواردن دەدەنە موسوڵمانان، وەڵامی سەلامیان دەدەنەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خِيَارُ عِبَادِ اللهِ مِن هَذِهِ الأُمَّةِ الّذِينَ إِذا رُوُا ذُكِرَ اللهُ لِرُؤيَتِهِمْ))(١٧) واتە: باشترین بەندەکانی خودا لەم ئوممەتەی ئێمەدا، ئەوانەن کە بە بینینیان خودا بەبیری خەڵکی دەهێننەوە، ئامۆژگاریان دەکەن، هەردەم هانیان دەدەن بۆ چاکە، خۆدوور دەگردن لە خراپە.

---

١٣- صحيح : (الجامع الصغير) (٢٦٠٢)، (المشكاة) (٤٩٩٣).

١٤- صحيح : (الصحيحة) (٢٨٥)، (صحيح الجامع) (٣٣١١).

١٥- صحيح : (صحيح الجامع) (٣٢٦٣)، (صحيح الترغيب) (٤٩٦)، (الصحيحة) (٢٥٣٣).

١٦- حسن : (صحيح الجامع) (٣٣١٨).

١٧- صحيح : (الصحيحة ) (٢٨٤٩)، (صحيح الترغيب) (٢٨٢٤).

## باشترین هاوڕێ

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُ الأَصْحَابِ عِندَ اللهِ تَعَالَى خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ))[١٨] واتە: باشترین هاوڕێ لای خودا ئەوانەن کە باشترین کەسن بۆ هاوڕێ کانی خۆیان.

## باشترین دراوسێ

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُ الْجِيرَانِ عِندَ اللهِ تَعَالَى خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ))[١٩] واتە: باشترین دراوسێ لای خودا ئەوەیە کە باشترین کەس بێت بۆ دراوسێ کانی خۆی.

## باشترین ئافرەتانی موسوڵمان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُ النِّسَاءِ مَنْ تَسُرُّكَ إِذَ أَبْصَرْتَ))[٢٠] واتە: باشترین هاوسەرانی موسوڵمانان ئەوانەن کە بە بینینیان مێردەکانیان دڵخۆش دەکەن، وە هەر فەرمانێکیان پێکرا گوێ رایەڵی مێردەکانیان دەکەن و لە قسەیان دەرناچن، داوێنی خۆیان و سامانی مێردەکانیان دەپاریزن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُ نِسَاءِكُمْ الْوَدُود،

---

١٨- صحيح : (المشكاة ) (٤٩٨٧)، (صحيح الترغيب) (٢٥٦٧)، (صحيح الجامع) (٣٢٦٣).

١٩- صحيح :(صحيح الجامع) (٣٢٧٠)، (الصحيحة) (١٠٣).

٢٠- صحيح :(الصحيحة) (١٨٣٨)، (صحيح الجامع) (٣٢٩٥).

الْوَلُـوُد، الْعَئُـود، الَّذي إِذَا ظُلِمَـت، قَالَتْ هذه يَدِي في يَـدِك، لاَ أَذوق غمضاً حَتَّى تَرْضَى))[21] واتە: باشترین هاوسەرانی موسوڵمانان ئەوانەیانن کـە خاوەن منداڵن، دڵپاکن، بـێ کینە ورقن، گەر مێردەکانیان ستەمیشیان لێ بکەن، ئەوان دێن و ئاشتیان دەکەنەوە، دەست دەخەنـە نـاو دەسـتی مێردەکانیان و دەڵێن: هەتـا لێم ڕازی نەبیت من ناخەوم.

باشـترینی کەسـەکان ئەو کەسـەیە کە تەمەنی درێژە لە ئیسـلامدا، وە زۆر زیکرەکانی وتۆتـەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێـت: ((لیسَ أَحَدٌ أَفْضَلَ عِندَ اللهِ من مُؤْمِنٍ يُعَمَّرُ في الإِسلامِ لِتَكبِيرِه، وَتَسْبِيحِـهِ، وَتَهْلِيلِـهِ، وَتَحْمِيـدِهِ))[22] واتە: هیچ کە سـێك نییە لە ناو موسوڵمانان دا باشتربێت لەو موسوڵمانەی کە تەمەنێکی زۆری بەسـەر بردووە لە ئیسلامەتیدا، ئەویش بەهۆی زۆر وتنەوەی: ((سُبْحَانَ الله، الحَمْدُلله، اللهُ أَكْبَر، لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله)).

## باشترین موسوڵمان

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسـیاری لێکـرا: ((أَيُّ الإِسْلامِ خَيْر؟)) فەرمووی: ((تُطعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلاَمُ عَلـى مَنْ عَرَفتَ، وَمَنْ لَمْ تَعْرِفُ))[23] واتە: باشترین موسوڵمان ئەو موسوڵمانەیە کەنان بدەیە، سڵاو

---

٢١- صحيح :(الصحيحة) (١٨٤٨)،(صحيح الجامع) (٣٣٢٦).
٢٢- صحيح :(الصحيحة) (٦٥٤)، (صحيح الجامع) (٥٣٦٦).
٢٣- صحيح : ( صحيح الأَدَبُ المُفرد) (٧٧٩)، (صحيح الترغيب) (٩٤٤)، (صحيح إبن ماجة ) (٣٢٥٣).

لە هەموو ئەوانە دەکات کە دەیان ناسێت وە لە ئەوانەیشی کە نایان ناسێت. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خَيْرُكُمْ مَنْ أَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَرَدَّ السَّلامَ))(٢٤) واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە خواردن دەداتە موسوڵمانان و وەڵامی سەلامیان دەداتەوە.

## باشترین شەهیدان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللهِ مَنْ سُفِكَ دَمُهُ، وَعُقِرَ جَوَادُهُ))(٢٥) واتە: باشترین شەهیدان لای خودا ئەوانەیانن کە بە ئەسپی خۆیانەوە دەچنە تێکۆشان و جیهاد لە پێناوی خوادا، پاشان ئەسپەکەی دەکوژرێت و خۆیشی شەهید دەبێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ القِيَامَةِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ لاَيَلْتَفِتُونَ وجُوهَهُمْ حَتَّى يُقْتَلُونَ، أُولَئِكَ يَتَلَبَّطُونَ فِي الغُرَفِ العُلَى وَيَضْحَكُ إِلَيهِمُ الرَّبُّ وَ إِذَا ضَحِكَ اللهُ تعالى إِلَى عَبْدٍ فِي مَوْطِنٍ فَلا حِسَابَ عَلَيهِ))(٢٦) واتە: باشترینی شەهیدەکان ئەوانەیانن کە لە ڕیزی پێشەوەن، ڕوو بە دوژمنانی خودا دەجەنگێن و ئاووڕ نادەنەوە و هەتا شەهید دەکرێن ئا ئەوانە خاوەنی کۆشکە بەرزەکانی بەهەشتن.

وە خودای گەورە بۆیان دێتە پێکەنین، هەر بەندەیەکیش

٢٤- حسن: رواه أحمد والحاكم.
٢٥- صحيح :(صحيح الجامع) (١١٠٨)، (الصحيحة) (١٥٠٤).
٢٦- صحيح :(صحيح الجامع) (١١٠٧).

لە دونیادا خودا لە شوێنێك دا بۆیی بێتە پێكەنین هیچ جۆرە لێپرسینەوە یەكی نابێت لە ڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ السَّاعَاتِ جُوفُ اللَّيلِ))(٢٧) واتە: باشترینی ساتەكان بۆ خواپەرستی نیوەی شەوە.

## باشترین ئافرەتانی ناو بەهەشت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ نِسَاءِ أَهْلُ الْجَنَّةِ))(٢٨) واتە: باشترین ئافرەتانی ناو بەهەشت ئەمانەن:

**یەكەم:** خەدیجەی كچی خوەیلید رضي الله عنها خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ یە ئەم پلەیەی بەچی؟ بە دەست هێنا؟ بە هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

لە فەرموودەیەكدا ئیمامی بەیهەقی گێراوەتەوە هەرچەندە (لاوازە) بەڵام بۆ زانین دەیهێنین، پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك كە گەڕایەوە لە دوای ئەوەی یەكەم ساتی وەحی بۆ هات لە ئەشكەوتی حەراء زۆر ترسا بەسەر هاتەكەی گێڕایەوە بۆ خەدیجە و فەرمووی: دەترسم و شێت ببم وتێك بچم ئەویش دڵی دایەوە و فەرمووی: هەرگیز خودا تۆ گرفتاری ئەوە ناكات تۆ یارمەتی هەژارو لێ قەوماو و كەم دەستان دەدەیت، یارمەتی

---

٢٧- صحيح :(صحيح الجامع) (١١٠٦)،(الصحيحة) (٥٥١).

٢٨- صحيح : (الصحيحة) (١٥٠٨)، (صحيح الجامع) (١١٣٥).

دەست بەسەر و یەخسیر دەدەیت، ئەوانەی کە پێویستییان بە یارمەتی هەیە تۆ بۆیان دابین دەکەیت.

دواجار ئەم پرسیارەی لێکرد و، فەرمووی: ئەو کەسەی کە دەڵێیت: دەهات بۆ لام لێرە دەیبینی، وتی: ئەرێ وە (الله) ئەی بینم، خەدیجە رضي الله عنها فەرمووی: ئایا؟ ئێستا ئەو لەم ژوورە دا دەیبینیت و لەمماڵەدایە فەرمووی: ئەوەتا لەویا سەیرمان دەکات واتە: جبریل عليه السلام ئەویش فەرمووی بووەستە، سەر پۆشەکەی سەری لابرد، (واتە: سەر پۆشیش لە سەردەمی جاهیلیش دا هەر هەبووە) سەرپۆشەکەی سەری لابرد فەرمووی: ئایا؟ ئێستا ئەی بینیت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر فەرمووی: خەمت نەبێت ئەوە شەیتان نییە ئەوە فریشتەیە مادەم سەر پۆشەکەم لە سەر لابرد لێرە نەما[٢٩]. کەوا بوو خەدیجەی کچی خوەیلید رضي الله عنها یەکەم ئافرەت و سەروەر و گەورەی تێکڕایی ئافرەتانی بەهەشتە.

**دووەمیان:** لە دوایی ئەو فاطیمەیە رضي الله عنها دواهەمین کچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لە ڕۆیشتنی، لە قسەکردنی، لە شێوازی ژیانی هەمووی لە باوکی دەچوو.

**سێیەمیان:** مەریەمی دایکی پێغەمبەر عیسایە عليه السلام.

**چوارەمیان:** ئاسیای کچی موزاحیمە ژنی فیرعەونە. سەرنج بدە مێردەکەی فیرعەون بێت، ئەویش باشترین ئافرەتە لای

---

٢٩- ضعيف : ( البيهقي (الدلائل) (٤٦٢)، وقال محققوه : إسناده ضعيف جداً.

خودای گەورە. ئەو ئافرەتە یە کە پێغەمبەر موسای عليه السلام لە ئامێز گرت و بووە دایکی دووەمی و بەخێوی کرد و گەورەی کردووو خۆشی ویست، وتی: : ﴿وَقَالَتِ ٱمۡرَأَتُ فِرۡعَوۡنَ قُرَّتُ عَيۡنٖ لِّي وَلَكَۖ لَا تَقۡتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ (القصص). واتە: بابـبێتە شادی و بەر چاو ڕوونی بۆ من و تۆ، فیرعەون وتی: من نامەوێت، ئەوە بوو لە ئەنجامدا بووە دوژمنی، ئەو ئاسیایە یە کە بڕوای بە پێغەمبەر موسا عليه السلام هێنا، دواتر فیرعەون سزای دا و لەبەرخۆر و ئەشکەنجەیەی ئەدا، هەر چوار پەلی بە مێخ بەستبووەوە لێی ئەدا و سزای ئەدا هەر کاتێك فیرعەون دەرۆیشت فریشتەکانی خودا دەهاتن بە باڵەکانی خۆیان سێبەریان بە سەر ئەو ئافرەتە بەڕێزە وە دەکرد، تاگەیشتە ساتی گیان دەرچوون، دوا جار داوای لە خودا کرد و فەرمووی: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمۡرَأَتَ فِرۡعَوۡنَ إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرۡعَوۡنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ١١﴾ (التحريم) واتە: خودایە ماڵ و کۆشکێکی تایبەتم بۆ بکەرەوە لای خۆت لە بەهەشتی بەریندا خودایە رزگارم بکە لە فیرعەون و کارە چەپەڵە کانی خودایە ڕزگارم بکە لە کۆمەڵ و دەستەی ستەم کاران[٣٠].

---

٣٠- صحيح : (الصحيحة) (٢٥٠٨).

# باشترینی کارە چاکەکان

پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الأَعْمَـالِ الْإِيمَانُ بِاللهِ وَحْدَه)) واتە: باشـترینی کارەکان لای خوای گەورە، بڕوا بوونە بە خودای تاك و تەنها. یاخود لە ڕیوایەتێك دا [إِيمَانٌ لَا شَكَّ فِيه] واتە: بڕوا بوونێکە کە گومانی لێ دوورە بە هەموو جۆرێك.

پاشـان ((جِهَادٌ لَا غُلُولَ فِيـه)) واتە: تێکۆشـانێکە کە گەندەڵی ودزی تێدا نەبێت. پاشـان پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الأَعْمَالِ عِنْدَ اللهِ تَعَالَى [الصَّلاةُ فِي أَوَّلِ وَقْتِهَا]))[٣١] واتە: باشترینی کارەچاکە کان لای خودای گەورە نوێژە لە یەکەم کاتی خۆیدا.

لـە ڕیوایەتێکی تر دا فەرمووی: ((باشـترین کار کە بیکات بۆ خوا نوێژە، پاشان نوێژە، پاشان هەر نوێژە)). وتیان: پاشان دوای ئـەو فەرمـووی: ((چاکەکردنە لەگەڵ دایك و باوك دا)). وتیـان: پاشـان دوای ئەو فەرمـووی: ((تێکۆشـانە لە پێناوی خوادا)).

هەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الأَعْمَالِ سُرُورٌ تُدْخِلُهُ عَلَى قَلْبِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ، تَكْشِفُ عَنْهُ كُرْبَةً، أَوْ تَقْضِي عَنْهُ دَيْنًا، أَوْ تَطْرُدُ عَنْهُ جُوعًا))[٣٢] واتە: باشـترینی کارەکان ئەوەیە دڵی موسوڵمانێك خۆش بکەیت بەوەی کە قەرزێکی بۆ بدەیتەوە، برسێیەتییەکی لێ بڕەوێنیتەوە، بڕۆیت کێشەیەکی بۆ چارەسەر بکەیت.

---

٣١- صحيح: (إبن حبان) (١٤٧٣)، (صحيح الجامع) (١٠٩٣).

٣٢- حسن: (الصحيحة) (١٤٩٤)، (صحيح الجامع) (١٠٩٦)، (صحيح الترغيب) (٣٠٧٨) واللفظ له.

## باشترین ئیمان و بڕوا

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ((أَفْضَلُ الإِيمَانِ الصَّبْرُ، وَالسَّمَاحَةُ))(٣٣) واتە: باشترین بەشی بڕوا ئارامگرتنە لەسەر داواکاری یەکانی خودا و پێغەمبەری خوا ﷺ، چاو لێپۆشین، ئەنجامدانی هەموو ئەو کارانەیە کە خوا پێی خۆشە، خۆگرتنە لە بەرامبەر بەڵاو موصیبەتەکاندا.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ((أَفْضَلُ الايمانِ أَنْ تُحِبَّ للهِ، وَتُبغِضَ للهِ (وَتُعْمَلُ لِسَانَكَ فِي ذِكْرِ اللهِ عزوجل وأَنْ تُحِبَّ للناسِ مَاتُحِبُّ لِنَفْسِكَ وَتُكْرِهُ لَهُمْ مَاتكرهُ لِنَفْسِكَ))(٣٤) واتە: باشترینی کارەکان ئەوەیە کە لەبەر خوا شتێك، یان هەرکەسێکت خۆش بووێت، لەبەر خواش بیان بوغزێنی و ڕقت لێیان بێت. وە پاشان ئەوەیە کە زمانت سەر قاڵ بکەیت بە زیکر و یادی خوا. پاشان ئەوەیە کە ئەوەی پێت خۆشە بۆ خۆت، دەبێت پێشت خۆش بێت بۆ موسوڵمانان، وە ئەوەی پێت ناخۆشە بۆ خۆت بە هەمان شێوە پێت ناخۆش بێت بۆ برایانی موسوڵمانان.

## باشترین جیهاد و تێکۆشان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ((أَفْضَلُ الجِهَادِ أَنْ يُجَاهِدَ الرَّجُلُ

---

٣٣- صحيح :(الصحيحة) (٥٥٠)، (صحيح الجامع) (١٠٩٣).

٣٤- ((أخرجه : أحمد (٢٢١٣٠) : وقال محققوه : صحيح لغيره، وضعيفه الألباني في ضعيف الترغيب (١٧٨٤)، (ضعيف الجامع) (١٠٠١).

نَفْسَهُ هَوَاهُ))[٣٥] واتە: باشترین تێکۆشان ئەوەیە کە مرۆڤ دژبە دەروون و حەزو ئارەزووە چەوتەکانی خۆیی بووەستێتەوە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الْجِهَادِ وَأَجْمَلهُ حَجٌ مَبْرُور))[٣٦] واتە: باشترین تێکۆشان و جوانترین یان حەجێکی قبوڵ کراوە لە پێناوی خوادا.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ [في روايـة ((أَحْسن))] الْجِهَادِ [كَلِمَةُ حَقٍ] كَلِمَة عَدْلٍ عِندَ سُلْطَان جَائر))[٣٧] واتە: باشترین تێکۆشان وتنی: وشە یەکی ڕاست و ڕەوانە، یاخود گەیاندنی ڕاستی یەکە بە پادشایەکی ستەم کار.

وتیان: ((أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَل؟)) واتە: باشترین تێکۆشان چی یە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((أَنْ تُقَاتِلَ الْكُفَّارَ إِذَا لَقِيتَهُمْ، وَلاَ تَغْلُلْ، وَلاَ تَجْبُنْ))[٣٨] واتە: باشترین تێکۆشان ئەوەیە ڕوو بەڕووی بێ باوەڕان بوەستیتەوە و لەگەڵیان بجەنگیت وە دزی و گەندەڵی نەکەیت لە دەست کەوتەکاندا، نەترسێیت و ڕانەکەیت، لێیان هەڵنەیەیت. وترا: ((أَيُّ الْجِهَادِ أَفْضَل؟)) واتە: چاکترین تێکۆشان چی یە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَنْ عُقِرَ جَوادُهُ، وَأُهْرِيقَ

---

٣٥- صحيح : (صحيح الجامع) (١٠٩٩)، (الصحيحة) (١٤٩٦).
٣٦- ((صحيح : (صحيح النَّسَّائي) (٢٦٢٨).
٣٧- صحيح : (صحيح الجامع) (١١٠٠)، (الصحيحة) (٤٩١).
٣٨- صحيح : (الإيمان) (٥/١): صحيح بشواهده.

دَمُـهُ))[٣٩] واتـە: ئەو کەسـەیە کە سـەر و ماڵی تیـا دەچێت لە تێکۆشان و جیهاد لە پێناوی خوادا، واتە: ئەسپەکەی دەکوژرێت و خۆشـی شـەهید دەبێـت. وتیـان: کام تێکۆشـان باشـترە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ((مَنْ جَاهَدَ الْمُشْرِكِينَ بِمَالِهِ، وَنَفْسِهِ))[٤٠] واتە: ئەو کەسەیە کە بەرامبەر هاوتا بڕیاردەران (موشریکان) تێ دەکۆشێت و(جیهادیان لە بەرامبەر دەکات) بە سەر و ماڵی خۆیەوە دژ بەوان تێ دەکۆشێت.

## باشترین زیکرو یادی خوا

پێغەمبەری خـواﷺ دەفەرموێت:((أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ))[٤١] واتـە: باشـترین زیکر و یادی خوا وتنی: وشـە ((لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ)) یـە. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێـت: ((أَفْضَلُ الشُّكْرِ الْحَمْدُ للهِ))[٤٢] واتە: باشـترین سـوپاس گوزاریـش بۆ خودا وتنی: وشەی ((الْحَمْدُ للهِ))یە. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ للهِ))[٤٣] واتە: باشـترین نزاو دوعا وتنی: وشەی ((الْحَمْدُ للهِ)) یە.

---

٣٩- ((صحيح : أحمد (١٧٢٧)، (الصحيحة) (٥٥١).
٤٠- صحيح : (صحيح النَّسائي) (٢٥٢٦)، (الصحيحة) (١٥٠٤)، (صحيح أبو داود) (١١٩٦).
٤١- ((صحيح : (الصحيحة) (١٤٩٧).
٤٢- صحيح :(الصحيحة) (١٤٩٧).
٤٣- حسن : (المشكاة) (٢٣٠٦)، (إبن حبان) (٨٤٣)، (صحيح الترغيب) (١٥٢٦).

# باشترین زیکر لای خوای گەورە

پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الْكَلَامْ مَا أَصْطَفَى اللهُ لِمَلَآئِكَتِهِ أَوْ لِعِبَادِهِ سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ))[٤٤] باشترین وشە لای خودا ئەو وشەیەیە کە هەڵی بژاردووە بۆ تێکڕای فریشتەکان وبەندەکانی خۆیی کە بیڵێنەوە هەردەم ئەوەیش بریتییە لە: وتنی: ((سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ))یە.

هەروەهـا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویـت: ((أَفْضَلُ الْكَلَامِ بَعْدَ الْقُرْآنِ أَرْبَعَة)) واتە: باشـترین وشـە لە دوایی قورئان چوارە: ئەو وشـانەش بریتین لە ((سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ))[٤٥].

وە پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الدُّعَاءِ دُعَاءُ يَوْمِ عَرَفَـة، وَأَفْضَلُ مَاقُلْتُ أَنَا، وَالنَّبِيُّونَ مِنْ قَبْلِي ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير))[٤٦] واتە: باشـترین دوعاو نزا ئەو دوعـاو نزایەیە کە لە کێوی عەرەفە ئەنجام ئەدرێت، باشترین وشە کە من و تێکرایی برا پێغەمبەرەکانی پێش خۆم ﷺ وتومانـە: بریتی یە لە وتنی: ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِير)).

---

٤٤- صحيح :(الصحيحة) (١٤٩).

٤٥- صحيح : أحمد (٢٠٢٢٣)، قال محققوه: إسناده صحيح.

٤٦- حسن : (صحيح الترمذي) (٣٥٨٥)، والطبراني في (الكبير) (١٢٧٠) واللفظ له.

## باشترین دوعا و نزاو پارانەوە

وترا: ((أي الدُّعاءُ أفْضَل)) واتە: باشترین دوعا و نزا چی یە؟ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((سَلِ اللهَ العَفْوَ، وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ))[٤٧] واتە: باشترین دوعا و نزا ئەوەیە بڵێت: خودایە لێم ببورە و سەلامەتم بکە لە هەموو گرفتەکانی دونیا و لە قیامەت.

## باشترینی چاکەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الْحَسَنَاتِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ))[٤٨] واتە: باشترین چاکەکان، بەخشینەکان، بریتیە لە: زۆر وتنەوەی ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)).

## باشترین سورەتی قورئان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ القُرآنِ الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين))[٤٩] واتە: باشترین سورەتی قورئان لای خودا سورەتی (الفَاتحة) یە.

## باشترین عیبادەت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ العِبَادَةِ الدُّعَاء))[٥٠] واتە: باشترین عیبادەت لای خودای گەورە لەناو هەموویاندا

---

٤٧- صحيح: (صحيح الأَدَبُ المُفْرد) (٤٩٦)، (صحيح الجامع) (٣٦٢٥)، (الروض) (٩١٧).
٤٨- صحيح: (الصحيحة) (١٣٧٣)، (صحيح الترغيب) (٣١٦٣).
٤٩- صحيح: (صحيح الجامع) (١١٢٥).
٥٠- صحيح: (صحيح الجامع) (١١٢٢)، (الصحيحة) (١٥٧٩).

دوعاو پاڕانەوە و نزایە.

باشترین عیبادەتێک کە خێری شەستساڵی هەیە:
پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَقِيَامُ رَجُلٍ في سبيلِ الله سَّاعة، أَفْضَلُ مِن عِبادَةِ ستينَ سَنة))(٥١) واتە: وەستانی ساتێك لە ڕووی بێ باوەڕاندا لە پێناوی خودا باشترە لە ئەنجام دانی عیبادەتی شەست ساڵ.

## باشترینی نوێژەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّلاة طُولُ الْقُنت))(٥٢) واتە: باشترین بەشی نوێژ زۆر وەستان و مانەوەیە لە نوێژدا بۆ خوای گەورە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّلاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَة قِيَامُ اللَّيْل))(٥٣) واتە: باشترین نوێژلای خوای گەورە لە دوایی نوێژە فەرزەکان شەو نوێژە. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّلواتِ عِندَ الله تعَالى صلاةُ الصُبحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ في جَمَاعة))(٥٤) واتە: باشترین نوێژ لای خودا نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی یە بەجەماعەت لە مزگەوتدا.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّلاةِ

---

٥١- صحيح: (الصحيحة) (١٩٠١)، (المشكاة)(٤٨٦٥)، (صحيح الجامع) (٥٨٨٥).
٥٢- صحيح: (صحيح الجامع) (١١١٨).
٥٣- صحيح: (صحيح الترغيب) (٦١٥)، (صحيح النسائي) (٦١٤).
٥٤- صحيح: (صحيح الجامع) (١١١٩)، (الصحيحة) (١٥٦٦).

صَلاةُ الْمَرْءِ في بيْتِهِ إلاَّ الْمَكْتُوبَةَ))[٥٥] واتە: باشترین نوێژ ئەو نوێژە یە کە مرۆڤ لەماڵی خۆیدا بۆ خوای ئەنجام دەدات جگە لە نوێژە فەرزەکان. وە باشترین نوێژە فەرز ئەو نوێژەیە کە لە مزگەوتدا ئەنجام دەدرێت بۆ خوا.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلاةُ الجَمَاعَةِ أَفْضَلُ مِن صَلاَةِ الفَذ بِسَبْعٍ وَعِشرِينَ دَرَجَةً))[٥٦] واتە: نوێژی جەماعەت باشترە لای خوا لە بیست وحەوت نوێژ، یاخود بیست وحەوت پلەی زیاترە لەو نوێژەی بە تاك بۆ خوا ئەنجام ئەدرێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((صَلاةٌ في مَسْجِدي أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ الصَّلاةِ فيمَا سِواه))[٥٧] واتە: ئەنجامدانی نوێژێك لە مزگەوتەکەی خۆمدا (واتە: لە مەدینە) چاکترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی تردا. جگەلە مَسْجِدُ الحَرَام.

(مَسْجِدُ الحَرَام)ی کەعبەی شەریفیش، نوێژێك تیایدا باشترە لە سەد هەزار نوێژ کە بۆ خوا ئەنجام بدرێت، لە مزگەوتە کانی تری سەر زەویدا.

## باشترین ڕۆژوو

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّوْمِ صَوْمُ أَخي دَاوُد، كَانَ يَصُومُ يَوْماً وَيُفْطِرُ يَوماً))[٥٨] واتە: باشترین ڕۆژوو ڕۆژووی

---

٥٥- صحيح :(صحيح الجامع) (١١١٧)، صحيح :(صحيح أبي داود) (١٣٠١).
٥٦- صحيح :(مسلم) (٦٥٠).
٥٧- صحيح : (مسلم) (١٣٩٥).
٥٨- صحيح :(صحيح الجامع) (١١٢٠).

پێغەمبەر داوودی برامە ﷺ، کە ڕۆژێ بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژی بەڕۆژوو نەدەبوو، دەفەرمویت: ((أَعْبَدُ النَّاسِ)) واتە: خواپەرسترین مرۆڤ بوو لە سەر ڕووی زەویدا.

## باشترین مانگ دوایی ڕەمەزان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ صَوْمُ شَهْرُ اللهِ الذي تَدعُونَهُ الْمُحَرَم))[٥٩] واتە: باشترین مانگ کە تۆ تێیدا بەڕۆژوو بیت لە دوای مانگی ڕەمەزان بۆ خوا مانگی خوایە کە ئێوە پێی دەڵێن: مانگی موحەڕەم.

## باشترین حەج

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((حَجٌّ مَبْرُورَةٌ))[٦٠] واتە: چاکترین کار لە ئیسلام دا حەجێکی قبوڵ کراوە، کە نێوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا مرۆڤەکەی پێ بەرز ئەبێتەوە لای خوا بەبەراورد لە کارە چاکەکانی پێشتری. وە دەفەرمویت: ((أَفْضَلُ الحَجِّ الْعَجُّ والثَّجّ))[٦١] واتە: باشترین بەشی حەج خشەی خوێنی قوربانی یەکانە لەمینا لەگەڵ وتنەوەی ((اللهُ أَكْبَر، اللهُ أَكْبَر))ی کاتی سەربڕینیان بۆ خودای گەورە.

---

٥٩- صحيح: (صحيح الجامع) (١١٢١)، (الإرواء) (٩٥١).
٦٠- صحيح: (صحيح الجامع) (١٠٩١).
٦١- حسن: (صحيح الجامع) (١١٠١)، (الصحيحة) (١٥٠٠).

## باشترین ئیسلامەتی

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الإِسْلَامِ الْحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ))(٦٢) واتە: باشترین ئیسلامەتی ئەوە یە چاو لێ پۆشەر بێت، دووربێت لە هەموو هاوتا بۆ خودا بڕیار دانێك.

## باشترین پەناگرتن

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : (( مَاتَعَوذ النَّاس بِأَفْضَل مِنهُمَا))(٦٣) واتە: باشترین شتێك کەمرۆڤە کان خۆیانی پێ پەنابدن لە شەیتان و گرفتەکانی، وتنەوەی سورەتی: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ①﴾ (الفلق) و﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ①﴾ (الناس). کە خوا دەیکاتە هۆکاری پەنادانی خاوەنەکەی لە زۆرێك لەتاوان و گوناه و ئەوانەی کە لێی دەترسێت.

لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَلَا أُخبِرُك بِأَفْضَل مَاتَعُوذُ بِه المُتَعَوذُون.))(٦٤) واتە: ئایا؟ پێت بڵێم: باشترین شتێك مرۆڤ خۆی پێ پەنا بدات چییە؟ وتنەوەی سورەتی: ((الفَلَقُ و النَّاسَ)).

---

٦٢- حسن : (صحيح الجامع) (١٠٩٠).

٦٣- صحيح : (صحيح الجامع) (٤٣٩٦)، (صحيح النسَّائي) (٥٤٢٩).

٦٤- صحيح :(السنة) (٥٤٣٢)، أحمد (١٧٣٨٩) وقال محققوه : صحيح.

## باشترین ڕۆژانی دونیا

پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ أَيَّامِ الدُّنيَـا الْعَشْر))(٦٥) واتـە: باشـترین ڕۆژانی دونیـا دە ڕۆژی یەکەمی مانگی ((ذي الحِجة)) یە، لە ناویشیاندا ((أَفْضَلُ الأَيَّامِ عند الله يَوْمُ النَّحْر، وَيَوْمُ القَرّ))(٦٦) واتە: باشترینیان ڕۆژی یەکەمی: جەژنی قوربانە لای خودا، لە پاشان ڕۆژی دووەمیان: کە ڕۆژوو مانەوەیە لە مینا.

## باشترین ڕۆژەکانی هەفتە

پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرمویـت: ((أَفْضَلُ الأَيَّامِ عِنْدَ اللهِ يَوْمَ الْجُمُعَـة))(٦٧) واتە: باشـترین ڕۆژێك لە هەفتـەدا لای خوا ڕۆژی جومعەیە، چونکە خوای گـەورە لە ڕۆژی جومعەدا پێغەمبەر ئادەمـی عليه السلام تیادا دروسـت گراوە. هـەر لـە ڕۆژی جومعەدا پێغەمبـەر ئـادەم عليه السلام چۆتە بەهەشـتەوە. وە هـەر لە ڕۆژی جومعەدا پێغەمبەر ئادەم عليه السلام دەرکراوە لە بەهەشت. وەهەر لە ڕۆژی جومعەدا پێغەمبەر ئادەم عليه السلام وەفاتی کردووە و مردووە. وە لـە ڕۆژی جومعەدا خـودا تەوبەی لە پێغەمبـەر ئادەم u قبوڵ کردووە. وەهەر لەو ڕۆژەدا قیامەتیش هەڵدەسێت وبەرپا ئەبێت، لە نێوان نوێژی بەیانی هەتا ڕۆژ هەڵدێت.

---

٦٥- صحيح :(صحيح الترغيب) (١١٥٠)، (صحيح الجامع) (١١٣٣).
٦٦- صحيح :(صحيح أبي داود) (١٥٤٩)، (ابن حبان) (٢٨١١)، (الإرواء) (١٩٥٨).
٦٧- صحيح :(صحيح الجامع) (١٠٩٨)، (الصحيحة) (١٥٠٢).

## باشترین بژێوی پەیداکردن

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الكَسْبِ بَيْعٌ مَبْرُورٌ وعَمَلُ الرَّجُلِ بِيَدِيه))(٦٨) واتە: باشترینی بژێوی پەیداکردن فرۆشیاری و چاکەکاری یە، یاخود ئەو کارەیە کە مرۆڤ بە دەست و ماندویی خۆی پەیدای دەکات.

## چاکترین پارە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الدَّنَانِير)) واتە: چاکترین دینارەکان لای خوا کە بەخشرابن ((دِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلى عِيَالِه))(٦٩) واتە: باشترینیان ئەو دینارەیە کە مرۆڤ سەرفی دەکات بۆ خانەوادە و هاوسەر و منداڵەکانی.

پاشان ((يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلى أَصْحَابِهِ في سبيلِ الله)) واتە: ئەو دینارەیە کە مرۆڤ بۆ هاوڕێیان و موسوڵمانەکانی سەرفی دەکات لە جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا. پاشان ((وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلى دَآبَّتِهِ في سبيلِ الله)) واتە: ئەو دینارەیە کە سەرف دەکرێت بۆ خزمەتکردنی ئاڵفی ئەو ئەسپانەی کە تێکۆشەران لە سەری دەجەنگێن لەپێناوی خوادا.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ

---

٦٨- صحيح : (صحيح الجامع) (١١٢٦)، (الصحيحة) (٦٠٧).
٦٩- صحيح :(صحيح الجامع) (١١٠٣).

جُهْدُ الْمُقِل))[٧٠] واتە: باشـترین صەدەقەو بەخشین ئەو بەخشینە یە کە مرۆڤ لە دەسـت کورتی دا ببیبەخشێت واتە: دەسـتی کورتەوە تواناى کەمە و لە گوێرەی توانایی خۆیی دە بەخشێت.

هەروەهـا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سَبَقَ دِرْهَمٌ مَائَةَ أَلْفِ دِرْهَم)) واتە: درهەمێك پێش سـەد هەزار درهەم کەوت لای خودا.

**یەکـەم:** مرۆڤێك لە هەموو سـامانی دونیادا دوو درهەمی هەیە، یەك درهەمی هێناو کردی بەخێر لە پێناوی خوادا.

**دووەم:** دەوڵەمەنـد و سـامان دارێکـە دەچێـت لـە نـاو سـامانەکەی دا سەد هەزار درهەم دەهێنێت و دەیکات بە خێر لە پێناوی خوادا. ئەو تەنها درهەمە یان (دینارە)ی ئەو هەژارە لە سـەد هەزار درهەمەکەی ئەو دەوڵەمەندە زۆر گەورە ترە و بەبایەخترە، چونکە هەژارە کە نیوەی سـامانە کەی بەخشیوە، دەوڵەمەندە کەش بەشێکی کەمی سامانەکەی بەخشیوە.

## باشترین چاکە

پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ إِصلاحُ ذاتِ الْبَيْنِ))[٧١] واتە: باشـترین بەخشـین وچاکـە و صەدەقە ئەوەیە کێشەی نێوانی دوو موسوڵمان چاك بکەیت.

---

٧٠- صحيح : (صحيح الجامع) (١١١٢)، (الصحيحة) (٥٦٦).

٧١- صحيح : (الصحيحة) (٢٦٣٩)، (صحيح الترغيب) (٢٨١٦).

## باشترین پلە و پایە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: ((أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ، وَالصَّلاةِ، وَالصَّدَقَةِ)) واتە: ئایا پێتان بڵێم: شتێك کە پلەی باشتر و زیاتر بێت لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات؟ وتیان: چییە؟ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دووکەس ئاشت بکەرەوە یاخود گرفتی نیوان خۆت لەگەل موسوڵمانان چارسەر بکە و لەگەڵیان ئاشت ببەرەوە، چونکە ((الْبُغْضَاءُ هِيَ الْحَالِقَةُ)) [٧٢] واتە: یەکتر بوغزاندن تاشەرە، ناڵێم: تاشەری قژە، بەڵکو (ولكنْ تحلقُ الدِّين) تاشەری ئایینە، واتە: هەرکەسێك ڕقی لە موسوڵمانێك بێت، با دڵنیابێت تاشەری دینی خۆیەتی و دینی خۆیی لە ناو دەبات و دەیفەوتێنێت.

## چاکترین پارە خشین

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: ((أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ الصَّدَقَةُ على ذِي الرَّحِمِ الْكَاشِحِ)) [٧٣] واتە: چاکترین بەخشین و چاکە ئەو پارەیە یە کە دەیبەخشیتە خزمێکت کە تۆی خۆش ناوێت و ڕقی لێتە، تۆش خۆشت ناوێت؟ بۆچی؟ چونکە نێوانتان بەم پارە و یارمەتی یە زیاتر پێکەوە ژیان وگونجان و خۆشەویستی ولە یەکتر نزیك بوونەوە زیاتر لە نێوانتاندا دروست ئەبێت.

---

٧٢- صحيح : (صحيح الترغيب) (٢٦٩٣)، (صحيح الجامع) (٣٣٥٨).
٧٣- صحيح : (صحيح الجامع) (١١١٠)، (الإرواء) (٨٩٢).

هەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرمویێت: ((أَفْضَلُ الصَّدَقَة أَن تَتَصَدَّق، وَأَنتَ صَحِيحُ شحِيح، تَأْمُلُ الْغِنى، وَتَخْشى الفَقْر))(٧٤) واتە: باشترین بەخشینی پارە لە تەمەنتدا لەو ساتە یایە کە تۆ لەشت ساغەو پارەت زۆر لەدڵ خۆشویستە و کۆی دەکەیتە وە بۆ ئەوەی پێی دەوڵەمەند بیت وە زۆریش لە هەژاری دەترسیت بەلام تۆ زۆر لە خۆت دەکەیت و چاو لەهەموو ئەوانە دەپۆشی و لەبەر خوایش دەیبەخشیت.

## باشترین خێر ئەوەیە کە دەوڵەمەند بیبەخشێت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویێت: ((خَيْرُ الصَّدَقَة مَا أَبْقَت غِنَى)) لە ڕیوایەتێکەدا ((مَا كَانَ عَنْ ظَهرِ غِنَى))(٧٥) بە دوو: مانا هاتووە باشترین خێر وبەخشین ئەوەیە کە دەوڵەمەند بیبەخشێت چونکە چاوی لە دوانی یە؟ لای ئەو ئەوەی بەخشیوەتی هەر هیچ نی یە. بەڵام لەوە ئەچێ موسوڵمانێکی تر هەر ئەوەی هەیە زۆر ئەکات لە خۆی دەی بەخشێت پاشان دەکەوێتە خەیاڵ و خولیایی، تۆ بڵێیت: (پێی شیا پێی نەشیا ئێستا ئەوە چی لێ ئەکات تازە چۆن لە دەستم دەرچوو) هەر وەکو خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿....فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾﴾ (الإسراء) واتە: دائەنیشیت و لۆمەی خۆت ئەکەیت و ئاخی لێ هەڵ ئەکێشیت

---

٧٤- صحيح : (صحيح الجامع) (١١١١)، (الإرواء) (١٦٠٢).
٧٥- صحيح : (صحيح الجامع) (١١١٥)، (الإرواء) (٤٤٩).

و لە ئەنجامدا بەرامبەریش خێری لێنابینێت.

ئـەی باشـترین چاکە و بەخشـین کامەیـە؟ ئەوەیە کە مرۆڤێك بیبەخشێت و چاوی لە دوایی نەبێت. یاخود ((مَا أَبْقَتْ غِنى)) واتە: باشترین بەخشین ئەو بەخشینەیە کەلەخۆت زیادە و خۆت بە هۆیەوە نەکەوێتە هەژاری یەوە لەو شـتەدا کەدەی بەخشیت.

## چاکترین بەخشین ئاو بەخشینە

هەروەها پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّدَقَةِ سَقـيِ الْمَـاء))[٧٦] واتە: چاکترین بەخشـین و خێـر لای خودا ئاو بەخشـینە، ئیتـر ئایا بیـر هەڵکەندنـە؟ یاخود بەڕرادێکە دای ئەنێـت لە مزگەوتدا یان لەشـوێنکی گشـتیدا بۆ ئەوەی موسـوڵمانان یان ئاژەڵان و پەلـەوەران لێی بخۆنەوە؟. یاخود جۆگە ئاوێکە ڕایدەکێشیت بۆ ناوچەیەك مرۆڤەکان، ئاژەڵەکان، کشـتوکاڵەکان، سـوج مەند دەبن لێی؟ لە هەموو ڕووِ یەکەوە، ئەوانە هەمووی پێیان دەوترێت: ((سَقِي الْمَاء)).

## باشترین بەخشین لای خوا خۆبەخشینە

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ الصَّدَقَاتْ ظِلُّ فُسْطَاة في سبيل الله))[٧٧] واتە: چاکترین بەخشین لای خودا ئەوەیە

٧٦- حسن: (صحيح الجامع) (١١١٣)، (الإرواء) (١٩١٢).
٧٧- حسن: (صحيح الترغيب) (١٢٤٠)، (صحيح الجامع) (١١٠٧)، (المشكاة) (٣٨٢٧).

کە خۆت بەخشیت لە پێناوی خوادا لە سێبەری دەوارێکدای، لە گەرمای نیوەڕۆ یەکدا ڕوو بەڕوویی دوژمنانی خوا، یاخودا وەستاویتەوە دەوار و سێبەر و هەر کارئاسانی یەکی ترە کە دەی بەخشیتە هەژارێك، یاخود تێکۆشەران لە پێناوی خودا.

((مَنحَـةُ خَادمٍ في سَبِيلِ الله)) واتە: باشترین بەخشین ئەوەیە خزمەتکارێـك دەگریت بۆ کەسێك کـە ناتوانێـت کارەکانی خـۆی ڕاپەڕێنێت، بۆنموونە: مرۆڤێکـە کە لەجێگادا کەوتووە خزمەتکارێکـی بۆ دەگریـت تا جوان خزمەتی بـکات، یاخود کەسێکە نابینایە یاخود ئیفلیجە یاخود کەم ئەندامە ناتوانێت کارەکانـی ڕاپەڕێنێـت وەکـو پێویسـت، تۆ بە پـارەی خۆت خزمەتکارێکی بۆ دابیـن دەکەیت. ((أَوْ طَرُقَةُ فَحْـلٍ في سَبِيلِ الله))(٧٨) واتە: یاخود ئەوەیە ئەسـپێکی نێر ببەخشیت تا بپەڕێت لە ئەسپێکی مێ بۆ ئەوەی ژمارە و وەچەیان زیاد بێت، تا دوا ڕۆژ وەك کەرەستەیەکی جەنگ لە ڕووی دوژمناندا بەکاربهێنرێت.

کەواتـە لـەم ڕۆژدا هەموو ئـەو ئامێرانـە دەگرێتەوە کە موسـوڵمانان و خەڵکی لەشـوێنە گشـتی یەکاندا تێکڕا سود و بەهرەی لێ وەردەگرن.

باشترینی بڕوادار ئەوانەیانن کە تێکەڵ بە خەڵکی دەبن و ئارامدەگرن لەسەر نارەحەتی یەکانیان: ((المُؤمنُ الّذي يُخَالطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلى أَذَا هُمْ خَيْرٌ)) لە ڕوایەتێکدا ((أَفْضَلُ مِن الَّذي لا يُخَالِطُهُم وَلاَ

٧٨- حسن: (صحيح الجامع) (٩١١٠٩).

يَصْبِرُ عَلى أَذاهُم))[٧٩] واتە: ئەو بڕوادارەی کە تێکەڵ بە موسوڵمانان دەبێت و ئارامگرە لەسەر نارەحەتی و تێکەڵ بوونیان باشترە لای خودا لە و بڕوادارەی کە تێکەڵ بە موسوڵمانان نابێت وە ئەگەر تێکەڵیش بوو ئارامگری ئازارو کێشەیان ناکات.

## چاکترین دەرمان بۆ چارسەری نەخۆشیەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((أَفْضَلُ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحُجَامَةُ))[٨٠] واتە: باشترین دەرمانێك ئێوە بە کارتان هێنابێت کەڵەشاخە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((الشِّفَاءُ في الثَّلاثَ)) واتە: شیفای تێکڕایی دەردەکان لە سێ شتدایە، ((شَرطَةُ مِحْجَم، أَوْ شَرْبَةُ عَسَلٍ، أَوْ كَيَّةٌ بِالنّار، وَأَنا أَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَي)) واتە: شیفای هەموو دەردەکان لەم سێ شتەدایە.

**یەکەم:** لە تیغێکی کەڵەشاخ گرتندایە یاخود تیغێك مەبەستی لە شوێنی برینەکەیەتی کە خوێنی لێدێتە دەرەوە.

**دووەم:** لە شەربەتێکی هەنگوین دا یە واتە: دەبێت بە شێوەی شەربەتی مرۆڤ بیخواتەوە.

---

٧٩- صحيح : (المشكاة) (٥٠٨٧)، (الصحيحة) (٩٣٩)، (صحيح إبن حبان) (٤٠٣٢).

٨٠- صحيح : (صحيح الجامع) (١٥٧٢)، (مختصر الشمائل) (٣٠٩).

**سێیەم:** داغکردنە بەشێوەی سوتان بەئاگر بەڵام دەفەرموێت: من داوا ئەکەم لە ئوممەتەکەم داغ کردن بەکار نەهێنن.

عیمرانـی کوڕی حوصەین ﷺ سـی سـاڵ، لەسـەر جێگا بـوو بۆ خۆیـی دەیفەرموو: یادوستایشـی فریشـتەکانم گوێ لێبوو قسـەیان لەگەڵ ئەکردم سـەلامیان لێ ئەکردم، ئەوەندە ئارامگربووم لەسەر ئەو نەخۆشی یە. تا دواتر وتیان: داغکردن زۆر چاکـە داغـی بکە چاك ئەبێتەوە. وتـم: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغـەی کردووە، زۆر یـان لێکردم بە کارم هێنا، دەنگی مەلائیکە کۆتایـی پێهات هەتا تەوبە و(أستغفر الله)م، زۆر ئەکرد ئینجا دووبارە گوێم لە دەنگ و یاد یان دەبوو، سڵاویان ئەکردو نزیك ئەبوونەوە لە من و هەستم پێ ئەکردن[٨١].

کەواتـە باشـتر وایە داغکـردن ئەگەر ناچـار نەبێت یان دکتـۆر بۆ دیـاری بکات ئەگینا تابتوانرێت ئـەو داغکردنە بە کارنەهێنرێت، چونکە داغکردن بۆ بێ باوەڕانە لە جەهەننەمدا کـە ناوچاوان یان پێ داغ ئەکرێت، پشـتیان پێ داغ ئەکرێت، لای ڕاسـت و چەپ یان پێداغ ئەکرێت، هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێـت: ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾﴾ (التوبة) واتە: ئەمە ئەو پارەیە بوو کەئەتان دەبەخشی

---

٨١- أخرجه: إبن سعد (الطبقات) (٤/٢١٦).

لەپێناوی خوادا و زەکاتەکەیتان نەئەدا.

یەکێـك لـە کوڕەکانی عەبـدوڵای کوڕی عومـەری کوڕی خەطاب ﵁ لە سـەرەمەرگدا هەر سـەیری بەڕەیەکی ماڵەکە و سـەیری ژێری بەڕەکەی ئەکرد، وەفاتی کرد دواتر عەبدوڵا وتی: ئادەی ژێری ئەو بەڕەیە تەماشـا بکـەن؟ بینییان پێنج درهەمی تێدایە عەبدوڵای کوڕی عومەر ﵁ بە پەژارەوە وتی: ئـەی هاوار کـوڕی خۆم تۆ بڵێیت پشـتت جێی ئـەم هەموو درهەمەی تێدا ببێتەوە پێتی داغ بکەن لە ڕۆژی قیامەتدا.

پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَا بَلَـغَ أَن تُـؤَدى زَكَاته فَزَكـيَ فَلَيْسَ بِكَنْـزِه))[٨٢] واتە: هەر سـامانێك بگاتە رادەی زەکات لـێ دەرکـردن و زەکاتی بدرێت بەگەنجینـە ناژمێردرێت ئەم هەڕەشـەیە نایگرێتەوە بەڵام لەسـەر بۆ چوونی ئەبو زەڕ ﵁ ئەیگرێتەوە، لەرسـتیدا بۆچونی یەکەم راسـترە و ئەوەش بۆ چوونی تێکڕایی صەحابەکانە و بەهێز ترە. چونکە پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَـنْ أَدّى زَكَاةَ مَاله فَقَدْ ذَهَـب عَنْهُ شَرَّهُ)) واتە: هەر کەسـێك زەکاتی ماڵەکەی بدات ئەوە زیان وچڵك و پیسی ماڵەکەی دوور خستۆتەوە.

بۆیـە جارێکیان دووان لە بنەماڵـەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتـن، وتیان: بۆ ئێمەیش ناکەیتـە بەرپرس لە کۆکردنەوەی زەکات دا، تا دواتر لە زەکاتەکەش بەشمان بدرێت، پێغەمبەری

٨٢- حسن : (صحيح أبي داود) (١٥٦٤)، (المشكاة) (١٨١٠).

خـوا ﷺ فەرمووی: ((مَا كُنتُ لأستعملكم عَلى غُسالَة ذُنُوبِ النَّاس))[٨٣] واتـە: من چۆن ئێـوەی بنەماڵەی خۆم دەکەمـە بەرپرس لە کۆکردنـەوەی لابەری چڵکی ماڵـی خەڵکیدا، چونکە بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزە و زەکات و خاوێن کەرەوەی سامانی خەڵکییان بە هیچ جۆرێك پێ ناشێت.

## باشترین ڕەوشت جوانی

وتیان: ((مَا خَيرُمَا أُعْطِيّ العَبدُ يَارَسُولَ الله)) واتە: باشترین بەهایەك خودا بەخشیبێتی بە مرۆڤێك چی یە؟ فەرمووی: ((خُلقٌ حَسَنْ))[٨٤] واتە: ڕەوشـتی جوانە، بۆ؟ چونکە ((إنَّ سُوءَ الخُلُقْ يُفْسِدُ العَمَل، كَمَا يُفسِدُ الخَلُّ وَالعَسَل))[٨٥] واتە: چۆن سـرکە بکەیتە هەنگوینەوە، تێکی ئەدات ڕەوشـتی ناشیرینیش هەموو عیبادەتەکانت پووچ دەکاتـەوە. لەوە هەمـوو کارە چاکەکانت و لە ناو دەبات و بێ پاداشتیان دەکات لای خوا.

## چاکترین خەڵات و بەها بریتی یە لەئارامگری

پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفەرموێت: ((مَا أُعْطِيَ أَحَـدٌ عَطَاءً خَيراً، وَأَوْسَعْ مِـنَ الصَّبْر))[٨٦] واتە: هیچ مرۆڤێك خـەڵات و بەهایەکی خودایـی پێنەدراوە فراوان تـر و بەنرختر بێت لەئارامگرتن،

---

٨٣- صحيح : (صحيح الترغيب) (٨٠٨).
٨٤- صحيح : (غاية المرام) (٢٩٢)، (المشكاة) (٤٥٣٢)، (صحيح أبي داود) (١٧٥٩).
٨٥- صحيح : (الصحيحة) (٩٠٦)، (صحيح الجامع) (١٧٦).
٨٦- صحيح : (صحيح أبي داود) (١٤٥١)، (صحيح الترغيب) (٣٣٩٥).

چونکە دونیا هەمووی ئارامگری یە، هەرکەسێك ئارامگربێت بە ڕاستی گەورە ترین و فراوانترین بەهای خودای پێ دراوە.

## باشترین عیبادەت بێ دەنگی یە

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو زەڕی ﷺ فەرمووی: ((عليك بحسن الخلق، وطول الصمت فوالذي نفسي بيده ما عمل الخلائق بمثلهما))(٨٧) واتە: ئاگات لەڕەوشتی جوان و بێ دەنگی بێت، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، بوونەوەران کاری گرنگی پڕ بایەخی بەو جۆرە یان هەرگیز ئەنجام نەداوە.

لە گێڕانەوە یەکی (لاواز) دا هاتووە بۆ زانین دەیهێنیین. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يا أبا ذر، ألا أدلك على أفضل العبادة، وأخفها على البدن، وأثقلها في الميزان، وأهونها على اللسان))(٨٨)

واتە: ئەبو زەڕ (خودا لێی ڕازی بێت) باشترین عیبادەتت پێبڵێم: کە ئەنجامدانی زۆر ئاسانە، سەنگی زۆر قورسە بۆ تەرازووی چاکە کانت لە قیامەتت دا، وە زۆر ئاسانە لە سەر زمان، وتی: چی یە؟ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((طول الصمت)) واتە: زۆر و بەردەوام بێدەنگ بوون ،بێدەنگ بوون عیبادەتە، بەڵام ((الساكت عن الحق شيطان أخرس))(٨٩) واتە: بێ دەنگ بوون و نەوتنی ڕاستیەکان، وا دەکات مرۆڤ بە شەیتانێکی لاڵ بژمێردرێت.

٨٧- صحيح : (الصحيحة) (١٩٣٨).

٨٨- ضعيف : (ضعيف الترغيب) (١٦٠١).

٨٩- قاله : أبو علي الدقاق (شرح النووي على مسلم) (٢/ ٢٠)، و(الأذكار) (٣٣٥).

کەواتە پێویستە لەبەر خوا قسە بکەیت، لەبەر خوا زانستی بە سود بگەیەنیت، ئامۆژگاری چواردەورت بکەیت، ئەوە باشترە لە بێدەنگی، بەڵام گەر لەوانە هەمووی دەرچوو، چاکترین عیبادەت و بەنرخترین و ئاسانترین و قورسترین یان لای خودا بێدەنگ بوونە، پاشان ((وَحُسْنُ الْخُلُق)) واتە: ڕەوشتی جوانە.

## چاکترین پێشەواکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خيار ائمتكم الذينَ تُحبُونَهم و يُحبونكم و تصلون عليهم و يصلونَ عليكم....))[٩٠]. واتە: باشترین پێشەواکانتان ئەوانەیانن کە ئێوەیان خۆش دەوێت و ئێوەش ئەوانتان خۆشدەوێت وە ئەوانەیانن کە شتایشتان دەکەن و دوعاتان بۆ دەکەن وە ئێوەش هەروەها.

## باشترین سەردەم

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير الناس القرن الذي أنا فيه ثم الثاني ثم الثالث))[٩١] واتە: باشترین سەدە کەباشترین خەڵکانی تێدا هاتۆتە دنیاوە، ئەم سەدەیەکە کە منی تیدا ژیاوم پاشان سەدەی دووەم پاشان سەدەی سێهەم.

---

٩٠- صحيح: مسلم (١٨٥٥).

٩١- حسن: (صحيح الجامع) (٣٢٨٨).

## باشترین ڕزق

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خیر الرزق الکفاف))[٩٢] واتە: باشترین ڕزق ئەو بەشە ڕزقەیە کە تەنها بەشت بکات.

## باشترین ئافرەتی وشتر سوار

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خیر النساء رکبن الابل صالح نساء قریش احناه علي ولدٍ في صغره وأرعاهُ علی زوج في ذات یده))[٩٣]. واتە: باشترین ئافرەت سواری پشتی وشتر ببوون ئافرەتە باشەکانی ناو ئافرەتانی قوڕەیشن کە زۆر بەبەزەین بۆ منداڵی خۆیان وە زۆر بەقەناعەتن بە بژێوی مێردەکانیان.

## باشترین ناو

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خیر اسمائکم عبدالله و عبدالرحمان و الحارث))[٩٤] . واتە: باشترین ناوەکانتان عەبدوڵڵاو عەبدوڕەحمان و چێنەرە.

## باشترین شوێن و جێگا

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خیر البقاع المساجد و

---

٩٢- حسن: (الصحیحة) (١٨٣٤)، (صحیح الجامع) (٣٢٧٥).
٩٣- صحیح : (الصحیحة) (١٠٥٢)، (صحیح الجامع) (٣٣٢٦).
٩٤-صحیح: (الصحیحة) (١٠٣)، صحیح الجامع (٣٢٧٠).

شر البقاع الأسواق))[٩٥]. واتە: باشترین جێگا مزگەوتەکانە وە خراپترین جێگاش بازاڕەکانە.

## باشترین دینداری

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير دينكم الورع))[٩٦]. واتە: باشترین دینداریتان خۆپاراستنە لە حەرام و قەدەغەکراوەکانتان.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير دينكم أيسره))[٩٧] واتە: باشترین دینداری ئەوەیە کە زۆر لەخۆکردنی تێدانەبێت.

## باشترین شایەت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير الشهادة ماشهد به صاحبها قبل ان يسألها))[٩٨]. واتە: باشترین شایەتی ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بێت و شایەتی بدات پێش ئەوەی داوای لێبکرێت.

## باشترین چاکەی سەرەمەرگ

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير العمل أن تفارق الدنيا ولِسانُكَ رطبٌ من ذكر الله))[٩٩]. واتە: باشترین چاکە لەسەرەمەگدا

---

٩٥-حسن: (صحيح الترغيب) (٣٢٣)، (صحيح الجامع) (٣٢٧١).
٩٦-صحيح: (صحيح الجامع) (٣٣٠٨).
٩٧-صحيح: (الصحيحة) (١٦٣٢). (صحيح الجامع) (٣٣٠٩).
٩٨-صحيح: (صحيح الجامع) (٣٢٧٦).
٩٩-صحيح: (الصحيحة) (١٨٣٩)، (صحيح الجامع) (٣٢٨٢).

ئەوەیە زمانت پاراو بێت بەزکری خوا پێش گیان کێشان.

## باشترین کاری بژێوی

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير الكسب كسب يد العامل اذا نصح))[١٠٠] واتە: باشترین کاری بژێوی کاری فەرمانبەریە گەر بە دڵسۆزی ئەنجام بدرێت.

## باشترین ڕیزەکانی نوێژ

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير صفوف الرجال أولها و شرها أخرها و خير صفوف النساء اخرها و شرها أولها))[١٠١].

واتە: باشترین ڕیزی نوێژی جەماعەتی پیاوان یەکەمینیانە وە خراپترینیان کۆتاهەمینیانە، وە باشترین ڕیزی نوێژی جەماعەتی ژنان کۆتاهەمینیانە وە خراپترینیان یەکەمینیانە.

## باشترین دانیشتنەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير المجالس أوسعها))[١٠٢]

واتە: باشترین دانیشتنەکان ئەوانەن کە فراوان بن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((سيد المجالس قباله القبلة))[١٠٣].

---

١٠٠-حسن: (صحيح الترغيب) (٧٧٤) (صحيح الجامع) (٣٢٨٣).

١٠١-صحيح: (صحيح الجامع) (٣٣١٠).

١٠٢-صحيح: (الصحيحة) (٨٣٢)، (صحيح الجامع) (٣٢٨٥).

١٠٣-حسن: (الصحيحة) (٢٦٤٥).

واتە: سەروەری دانیشتنەکان ئەوانەن کە ڕیان لە قبلەو و ڕوگەیە.

## باشترین مزگەوتەکانی ئافرەتەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير مساجد النساء قعر بيوتهن))(١٠٤). واتە: باشترین مزگەوتی ئافرەتان ناوماڵەکانیانە.

## باشترین جێگای سەردان کراو

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير ما ركبت اليه الرواحل مسجدي هذا و البيت العتيق))(١٠٥). واتە: باشترین شوێنێك کە مرۆڤ کۆچ و باری بۆ ئامادە بکات بچێتە سەردانی مزگەوتەکەی منە و مزگەوتی مەککەی پیرۆزە.

## باشترین ئاو

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير ماء علي وجه الارض ماء زمزم فيه طعام من الطعم و سفاء من السقم...))(١٠٦). واتە: باشترین ئاوێك لەسەر ڕوی زەویدا هەبێت ئاوی زمزمە، ئەو ئاوە خۆراکە بۆ ئەوەی پێویستی بەخواردن هەبێت وە چارەسەرە بۆ ئەوەی نەخۆشی هەبێت.

---

١٠٤-صحيح: (الصحيحة) (١٣٩٦).

١٠٥-صحيح: (الصحيحة) (١٦٤٨)، (صحيح الجامع) (٣٣٢٥).

١٠٦-صحيح: (الصحيحة) (١٠٥٦) (صحيح الجامع) (٣٣٢٢).

## باشترین جۆری ئەسپ

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((خير خيل الادهم الاقرح الارثم المحجل الثلاث مطلق اليمين فان لم يكن ادهم فكميت علي هذة الشية))[١٠٧]. واتە: باشترین جۆری ئەسپ ئەو ئەسپەیە کە ڕەنگی ڕەشە ناوچەوان و سەرلوت و لێوی سەروی پەڵەیەکی سپی پێوەیە، قاچ و دەستی پەڵەی سپی پێوەیە جگە لە دەستی ڕاستی، گەر ئەوەش دەست نەکەوت ڕەنگ ڕەشێکی سورباوی تێر و زاڵ بەسەر ڕەشیدا.

## باشترین مارەیی

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((خير الصداق ايسره))[١٠٨]. واتە: باشترین مارەی ئافرەت ئەوانەیانە کە ئاسان و گونجاوە.

## باشترین پۆشاك

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویت: ((خير ثيابكم البياض البيسوها احيائكم و كفنوا فيها موتاكم))[١٠٩]. واتە: باشترین پۆشاکەکانتان پۆشاکی سپیە، ئەو پۆشاکە بکەنە بەرگی زیندوەکانتان وە بیکەنە کفنی مردوەکانتان.

---

١٠٧-صحيح: (الصحيح الجامع) (٣٢٧٣).

١٠٨-صحيح: (الارواء) (١٩٢٤)، (صحيح الجامع) (٣٢٧٩).

١٠٩-صحيح: أحمد (٣٣٤٢) وقال محققوه: حديث صحيح.

## باشترین هاوڕی و بەتالیۆن و سوپا

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير الصحابة أربعة و خير السرايا أربعمائة و خير الجيوش أربعة الآف ولاتهزم اثناعشر الفاً من قلة)) [١١٠].

واتە: باشترین هاوڕێیەتی سەفەر ئەوەیە کە ژمارەیان چوار کەس بێت، وەباشترین بەتالیۆن ئەوەیە کە ژمارەیان چوارسەد کەس بێت وە باشترین سوپا ئەوەیە کە ژمارەیان چوار هەزار کەس بێت، وە گەر سوپا ژمارەی گەیشتە دوانزە هەزار هەرگیز بەهۆی کەمی ژمارەیەوە نابەزێت.

## باشترین جۆری خورما

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير تمراتكم البرني يذهب الداء ولا داء فيه))[١١١]. واتە: باشترین جۆری خورماکانتان (لەپاش عەجوە) جۆری بەرنیە دەبێتە هۆکاری چارەسەر وە هیچ نەخۆشیەکی لەگەڵدا نیە.

## باشترینتان لە دوای من

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خيركم خيركم لأهلي من بعدي))[١١٢]. واتە باشتریتان لە دوای من ئەوانەتانن کە سەروەری و ڕێزی هاوسەرەکانم دەپارێزن. (واتا بەچاکە باسیان دەکەن و

---

١١٠-صحيح: (الإرواء) (١٩٨٢)، (صحيح الجامع) (٣٢٧٨).

١١١-حسن: (الصحيحة) (١٨٨٤)، (صحيح الجامع) (٣٣٠٣).

١١٢-حسن: (الصحيحة) (١٨٤٥)، (صحيح الجامع) (٣٣١٥).

دوعایان بۆ دەکەن).

## باشترین مامەڵەی ئافرەت

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خيركم خيركم للنساء))(١١٣) . واتە: باشترینتان ئەوانەتان کە هەڵویست و ڕفتارتان زۆرباش و گونجاوە لەگەڵ سەرجەم ئافرەتان.

## باشترین مرۆڤەکان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خيار عبادالله الذين يراعون الشمس و النجوم و الاظلة لذكر الله))(١١٤) . واتە: باشترین مرۆڤەکان ئەوانەن کە چاودیری مانگ و ڕۆژ و مانگ و سیبەرەکانیان دەکەن بۆ کاتی نوێژکردن و یادکردنەکانیان.

## باشترین هاوسەرەکانتان

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير نسائكم الولود الودود المواسية المواتية اذا اتقين الله....))(١١٥) . واتە: باشترین هاوسەرە و ژنەکانتان ئەوانەیانن کە زۆر هاوسەر و منداڵەکانی خۆیان خۆشدەوێت و هاوکاری مێردەکانیان دەکەن و داواکاریەکانیان بۆ جێ بەجێ دەکەن وە لە خوا ترس و فەرمان بەرداری خودان.

---

١١٣-صحيح: (الصحيحة) (٢٨٥).
١١٤-حسن: الطبراني (الدعاء) (١٨٧٦) وقال محققه: سنده حسن.
١١٥-صحيح: (الصحيحة) (١٨٤٩)، (الصحيح الجامع) (٣٣٣٠).



## باشترین ڕۆژی کەڵەشاخ گرتن

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير يوم تحتجون فيه: سبع عسرة و تسع عشرة و احدي و عشرين))(١١٦) . واتە: باشترین ڕۆژ بۆ کەڵەشاخ گرتن ڕۆژی حەڤدەو و نۆزدە و بیست و یەکی مانگی عەرەبییە.

## باشترین کەس لە ڕۆژەسەختەکاندا

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((خير الناس في الفتن: رجلٌ اخذ بعنان فرسه خلف أعداءالله يخيفهم و يخيفونه، او رجلٌ معتزلٌ في باديته يؤدي حق الله عليه))(١١٧). واتە: باشترین کەس لە ڕۆژە سەخت و پڕ ئاژاوەکاندا مرۆڤێکە کە لغاوی ئەسپەکەی گرتووە و هێرش دەباتە سەر دوشمنانی خودا و ئەوان دەیترسینن و ئەویش ئەوان دەترسێنێت، وە پیاوێکی ترە بەدوای مەڕەکانیەوەیەتی زەکاتی دەداو و ئاینی دەپارێزێت و خۆی لەشەر و خراپە بەدوورگرتوە.

---

١١٦-حسن: (المشكاة) (٤٥٤٤)، (الصحيحة) (١٨٤٧)، (صحيح الجامع) (٣٣٣٢).

١١٧-صحيح: (الصحيحة) (٦٩٨).

# کۆتایی

هەموو موسوڵمانان هەندێك لەم کارە چاکانە وە لەم ئاکارە شیرینانە مان تێدا یە کەخوا پێی بەخشیوین، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ (النحل) واتە: هەرچی نعمەتێکتان هەیە هەموو لەلاین خوداوە پیتان بەخشاروە.

گەر هەستمان کرد تێماندایە سوپاسی خوا دەکەین، خوای گەورە پێی بەخشیوین، داوابکەین لە خودا کە بۆ مان زیاد بکات، لێمان نەسەنێتەوە، هەردەم لەسەر ئەو خورەوشتە بڕۆین تا ئەگەینەوە بە خوای خۆمان.

خۆ ئەگەر لەم بەها یانەمان تێدا نەبێت، داوا ئەکەین لە خوای گەورە وەك خۆی فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ﴿٦٠﴾ ﴾ (غافر) واتە: داوا بکەن بۆ تان جێبەجێ ئەکەم وەڵامتان ئەدەمەوە. داوا بکەین لە پەروەردگار کە ئەو ڕەوشتانەمان پێ ببەخشیت کە چاکترینەکانی تێدایە وەك ئەوانەی لەم فەرمودانەدا ئاماژەمان پێ کرد.